# فەزڵی

## سەڵەواتدان لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ

نوسینی پێشەوا

إسماعيل بن إسحاق القاضي

(١٩٩-٢٨٢ه)

تەحقیقی زانای فەرموودەناس

محمد ناصرالدين الألباني

ئامادەکردن و وەرکێڕانی

عوسمان ئەحمەد حاتەم



# فەزڵی

## سەڵەواتدان لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ

نوسینی پێشەوا

إسماعيل بن إسحاق القاضي

(١٩٩-٢٨٢ھ)

تەحقیقی زانای فەرموودەناس

محمد ناصرالدين الألباني



ئامادەکردن و وەرگێڕانی

عوسمان ئەحمەد حاتەم

بسم الله الرحمن الرحيم

## پێشەکی

الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله وعلى آله وصحبه ومن اتبع هداه، أما بعد:

ئەم کتێبە موبارەکە کەلە نوسینی پێشەوا (ئیسماعیلی کوڕی ئیسحاقی قازی)یە، تێیدا بە بەڵگەی ئایەت و فەرموودە و قسەی هاوەڵان و تابعیەکان باسی پەرستشێکی گەورە دەکات کە سەڵەواتدانە لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ، زانای ناودار (محمد ناصرالدين ئەلبانی) تەحقیقی کردووە و صەحیح و زەعیفی دیاری کردووە.

منیش وەرمگێڕاوە و ژمارەم بۆ فەرموودەکانی داناوە، بە جۆرێك ژمارەی یەکەم من دامناوە، ژمارەی دووەم شێخ ئەلبانی دایناوە، کۆی گشتی (١٠٧) فەرموودە و ئەسەرە، بەڵام من ئەوەی شێخ ئەلبانی بە

زەعیفی داناوە نەمهێناوە و ئەوەی هاومانایە یان ماناکەی لە فەرموودەکانی ترەوە نزیکە نەمهێناوە بۆیە ژمارەکەی بووەتە (٦٠).

لە پەراوێزدا قسەی شێخ ئەلبانیم لەسەر هەندێك لە فەرموودە و ئەسەرەکان هێناوە بۆ دیاری کردن، و چەند زاراوەیەکی هێناوە بۆ نموونە (مرسل) واتە: تابعییەك بڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت، (موقوف) واتە: قسەی هاوەڵی پێغەمبەری خوایە ﷺ، (مقطوع) واتە: قسەی تابعییە.

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ وَمَلَٰٓئِكَتَهُۥ يُصَلُّونَ عَلَى ٱلنَّبِيِّۚ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ صَلُّواْ عَلَيۡهِ وَسَلِّمُواْ تَسۡلِيمًا ٥٦﴾(الأحزاب).

واتە: بێگومان خوا و فریشتەکانی سەڵەوات دەدەن لەسەر پێغەمبەرەکەی، ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە سەڵەواتی لەسەر بدەن و سەلامی لێبکەن بە سەلامی ئیسلام.

ئیبن کەسیر باسێکی زانستی بە سودی هێناوە لەسەر ئەم ئایەتە ئەمە هەندێکییەتی، دەڵێت: بوخاری بە موعەلەقی لە ئەبوعالییەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: سەلاتی خوا: ستایشکردنییەتی لای فریشتە، سەلاتی فریشتە: نزا و پاڕانەوەیە؛ دیسان لە ئیبن عەباسەوە بە موعەلەقی ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ﴿يُصَلُّونَ﴾ واتە: داوای بەرەکەتی بۆ دەکەن؛ ترمزی دەڵێت: لە سوفیانی سەوری و زانایانی ترەوە ڕیوایەتکراوە دەڵێن: سەلاتی پەروەردگار: ڕەحمەتە، صەلاتی فریشتە: داوای لێخۆشبوونە؛ مەبەست لەم ئایەتە ئەوەیە: خوا بەندەکانی ئاگادار کردووەتەوە لە پلەوپایەی بەندە و پێغەمبەرەکەی لای خۆی و ستایشی کردووە لای فریشتە نزیکەکان، فریشتەکانیش سەڵەواتی لەسەر دەدەن، پاشان خوا فەرمان بە باوەڕداران دەکات لەسەر زەوی سەڵەواتی لەسەر بدەن، بۆ ئەوەی ستایشی سەر زەوی و ئاسمان هەموو پێکەوە لەسەری کۆببێتەوە، بوخاری لە تەفسیری ئەم

ئایەتەدا لە كەعبی كوڕی عوجرەوە ﷺ ڕیوایەتی كردووە دەڵێت: گوترا: ئەی پێغەمبەری خوا زانیمان چۆن سەلامت لێ دەكەین، ئەی چۆن سەڵەواتت لەسەر بدەین؟ فەرمووی: بڵێن: ((اللّٰهُمَّ صلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ، وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ، اللّٰهُمَّ بَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا بَارَكْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ))؛ و ئەحمەد لە كەعبی كوڕی عوجرەوە ﷺ ڕیوایەتی كردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: كاتێك ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ وَمَلَٰٓئِكَتَهُۥ يُصَلُّونَ عَلَى ٱلنَّبِيِّ﴾ گوتیان: چۆن سەڵەواتت لەسەر بدەین ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی بڵێن: ((اللهم صلِّ على محمدٍ، وعلى آل محمدٍ، كما صليتَ على إبراهيمَ، وعلى آلِ إبراهيمَ، إنك حميدٌ مجيدٌ، اللهم بارك على محمدٍ، وعلى آلِ محمدٍ، كما باركتَ على إبراهيمَ، وعلى آلِ إبراهيمَ، إنك حميدٌ مجيدٌ))؛ ئیبن كەسیر دەڵێت: مانای ئەو قسەیان كە دەڵێن: زانیمان چۆن سەلامت لێ بكەین

ئەوەیە: کەلە تەحیاتدا هاتووە و فێری دەکردن وەك چۆن سورەتێك لە قورئانی فێردەکردن، تێدا هاتووە: ((السَّلامُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللّهِ وَبَرَكَاتُهُ))؛ ئەم ئایەتە بەڵگەی ئەوەی تێدایە پێویستە لە نوێژ سەڵەوات لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ بدرێت بە یەکێك لەو شێوانەی کە لە فەرموودە صەحیحەکاندا هاتووە، ئەلبانی لە (أصل صفة الصلاة)(٣/٩٠٤)دا دەڵێت: وەك چۆن سەلامکردن لە پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەموو تەحیاتێکدا شەرعییە، بەوشێوەیەش سەڵەواتدان لەسەری شەرعییە دوای خوێندنی شایەتومان، لە تەحیاتی یەکەم و دووەمدا جیاوازی نییە، لەبەر گشتگیری بەڵگەکان و ڕەهاییان، لەوانە: ئەو ئایەتەی خوا دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ وَمَلَـٰٓئِكَتَهُۥ يُصَلُّونَ عَلَى ٱلنَّبِيِّ ۚ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ صَلُّوا۟ عَلَيْهِ وَسَلِّمُوا۟ تَسْلِيمًا ﴿٥٦﴾﴾، ئیبن قەیم لە (جلاء الأفهام)(٢٤٩)دا دەڵێت: ئەمە بەڵگەیە لە هەرکوێ خوێندنی سەلام شەرعی بێت، سەڵەوات لەسەردانیشی شەرعییە، بۆیە

کاتێك هاوەڵەکانی پرسیاریان لێکرد چۆن سەڵەواتی لەسەر بدەن و گوتیان: زانیمان چۆن سەلامت لێ بکەین، ئەی چۆن سەڵەواتت لەسەر بدەین؟، ئەمەش بەڵگەیە سەڵەوات و سەلام لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ پێکەوە گرێدراوە، و زانراوە ئەو کەسەی نوێژ دەکات سەلام لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەکات (واتە: لە تەحیاتی یەکەمدا)، لەبەر ئەوە شەرعییە بۆی سەڵەوات لەسەر پێغەمبەری خوا بدات ﷺ؛ بوخاری لە (الأدب المفرد) و ئیبن حبان لە ئەبوهورەیرەوە رضي الله عنه ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: جبریل عليه السلام هات بۆ لام پێی گوتم: لووتی بە خۆڵدا بچێت ئەو کەسەی ناوی تۆی لا دەهێنرێت و سەڵەواتت لەسەر نادات، لە وەڵامیدا، گوتم: ئامین؛ ئیبن عوسەیمین دەڵێت: واجبە هەرکاتێك ناوی پێغەمبەری خوا ﷺ هێنرا سەڵەواتی لەسەر بدرێت و ئەو فەرموودەیە دەکاتە بەڵگە؛ ئیبن کەسیر دەڵێت: نەوەوی دەڵێت: کەسێك سەڵەواتیدا لەسەر پێغەمبەری خوا

ﷺ سەلات و سەلام پێکەوە کۆ دەکاتەوە، تەنها یەکێکیان نەڵێت و بڵێت: (صلّى اللّهُ علَيْهِ) يان (علَيْهِ السَّلامُ) بە تەنها، ئەمەی نەوەوی دەیلێت: لە ئایەتەکەوە دەرهێنراوە، کە بریتییە لە: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ صَلُّواْ عَلَيۡهِ وَسَلِّمُواْ تَسۡلِيمًا﴾، باشتروایە بگوترێت: (صلى الله عليه وسلم تسليما).

و خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿هُوَ ٱلَّذِى يُصَلِّى عَلَيۡكُمۡ وَمَلَـٰٓئِكَتُهُۥ لِيُخۡرِجَكُم مِّنَ ٱلظُّلُمَـٰتِ إِلَى ٱلنُّورِۚ وَكَانَ بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ رَحِيمًا ﴿٤٣﴾﴾(الأحزاب).

واتە: خوا سەڵەواتتان لەسەر دەدات هەروەها فریشتەکانی، بۆ ئەوەی لە تاریکییەکان دەرتان بهێنن بۆ ڕووناکی، لە تاریکییەکانی گومڕاییەوە بۆ ڕووناکی هیدایەت، لە تاریکی کوفر و هاوبەش بڕیاردانەوە بۆ ڕووناکی باوەڕ، خوا بە بەزەییە بۆ باوەڕداران.

ئیبن کەسیر دەڵێت: سەڵەواتی خوای پەروەردگار لەسەر بەندەکەی ستایشکردنییەتی لای فریشتە، بوخاری ئەمەی لە ئەبوعالییەوە گێڕاوەتەوە، ئەبوجەعفەری ڕازی لە ڕەبیعی کوڕی ئەنەسەوە و لە ئەبوعالییەوە ڕیوایەتی کردووە، و جگە لە ئەو دەڵێن: سەڵەوات لە خواوە ڕەحمەتە، ڕەد دراوەتەوە بەو ئایەتەی کە دەفەرموێت: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ عَلَيۡهِمۡ صَلَوَٰتٞ مِّن رَّبِّهِمۡ وَرَحۡمَةٞۖ ١٥٧﴾(البَقَرَة)، لەوانەیە بگوترێت: ئەو دوو بۆچوونە ناکۆکنین و خوا زاناترە، سەڵەوات لە فریشتەوە مانای نزا و پاڕانەوە و داوای لێخۆشبوونە بۆ خەڵك.

عوسمان ئەحمەد حاتەم

٥/جمادى الآخرة/١٤٤٥

٢٠٢٣/١٢/٢٨

گەرمیان – کەلار



## فەزڵی سەڵەواتدان لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ

١. ١. قَالَ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ: قَالَ أَبُو طَلْحَةَ: ((إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسلَّمَ خَرَجَ عَلَيْهِمْ يَوْمًا يَعْرِفُونَ الْبِشْرَ فِي وَجْهِهِ، فَقَالُوا إِنَّا نَعْرِفُ الْآنَ فِي وَجْهِكَ الْبِشْرَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: أَجَلْ، أَتَانِي الْآنَ آتٍ مِنْ رَبِّي فَأَخْبَرَنِي أَنَّهُ لَنْ يُصَلِّيَ عَلَيَّ أَحَدٌ مِنْ أُمَّتِي إِلَّا رَدَّهَا اللَّهُ عَلَيْهِ عَشْرَ أَمْثَالِهَا)).

ئەنەسی کوڕی مالك رضي الله عنه دەڵێت: ئەبوتەڵحە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژێك هات بۆ لامان، مژدە و دەرەوشاوەییان بە ڕوخسارییەوە بینی، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا بەڕاستی ئێمە ئێستا مژدە و دەرەوشاوەی بە ڕوخسارتەوە دەبینین، فەرمووی بەڵێ، فریشتەیەك لای پەروەردگارمەوە هات بۆ لام، پێی ڕاگەیاندم: کەس لە ئوممەتەکەم نییە سەڵەواتم لەسەر بدات، ئیللا خوای پەروەردگار دە هێندەی سەلاواتەکەی وەلامی دەداتەوە.



٢. ٢. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ، عَنْ أَبِيهِ: ((أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ جَاءَ يَوْمًا وَالْبِشْرُ يُرَى فِي وَجْهِهِ، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّا نَرَى فِي وَجْهِكَ بِشْرًا لَمْ نَكُنْ نَرَاهُ قَالَ: أَجَلْ، إِنَّهُ أَتَانِي مَلَكٌ، فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ إِنَّ رَبَّكَ يَقُولُ: أَمَا يُرْضِيكَ أَلَّا يُصَلِّيَ عَلَيْكَ أَحَدٌ مِنْ أُمَّتِكَ إِلَّا صَلَّيْتُ عَلَيْهِ عَشْرًا، وَلَا سَلَّمَ عَلَيْكَ إِلَّا سَلَّمْتُ عَلَيْهِ عَشْرًا؟)).

له عبداللەی کوڕی ئەبوتەڵحەوە له باوکییەوە رحمه الله دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژێك هات درەوشاوەی و مژدە له ڕوخساریدا دیاربوو، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە درەوشاوەیی و مژدەیەك به ڕوخسارتەوە دەبینین پێشتر نەمان بینیوە، فەرمووی: بەڵێ، بێگومان فریشتەیەك هات بۆ لام، گوتی: ئەی محمد پەروەردگارت دەفەرموێت: ئایا ئەوە ڕازیت ناكات هەر کەسێك له ئوممەتەکەت سەڵاواتت لەسەر بدات، ئیللا من دە سەڵەواتی لەسەر بدەم، و هەر کەسێك سەلامت لێ بكات ئیللا دە جار سەلامی لێ دەکەم؟.



.٣ . عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ، عَنْ أَبِيهِ: قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: ((مَنْ صَلَّى عَلَيَّ وَاحِدَةً صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ عَشْرًا، فَلْيُكْثِرْ عَدَدَ ذَلِكَ أَوْ لِيُقِلَّ))[1].

له عبداللەی کوڕی ئەبوتەڵحەوە لە باوکییەوە رحمه الله دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: هەر کەسێك سەڵەواتێکم لەسەر بدات، خوا دە سەڵەواتی لەسەر دەدات، با ژمارەی سەڵەواتەکانی زیاد بکات یان کەمی بکات[2].



(١) . (إسناده ضعيف) وللحديث شاهد فلعله قوي به، وقد حسنه المنذري.

(٢). ئەو دەربڕینە مانای ئەوەیە: ئەگەر دەتەوێت پاداشتی زیاترت دەست بکەوێت سەڵەواتی زیاتر لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ بدە، ئەگەر کەم سەڵەوات بدەیت پاداشتی کەمترت دەست دەکەوێت، و هاندانە بۆ بەدەست هێنانی پاداشتی زیاتر.

٤. ٤. عن أَنَس بْنَ مَالِك قَالَ: ((خَرَجَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَتَبَرَّزُ فَلَمْ يَجِدْ أَحَدًا يَتْبَعُهُ فَهَرَعَ عُمَرُ فَاتَّبَعَهُ بِمَطْهَرَةٍ - يَعْنِي: إِدَاوَةً - فَوَجَدَهُ سَاجِدًا فِي شَرَبَةٍ، فَتَنَحَّى عُمَرُ فَجَلَسَ وَرَاءَهُ حَتَّى رَفَعَ رَأْسَهُ قَالَ: فَقَالَ: أَحْسَنْتَ يَا عُمَرُ حِينَ وَجَدْتَنِي سَاجِدًا فَتَنَحَّيْتَ عَنِّي، إِنَّ جِبْرِيلَ عَلَيْهِ السَّلَامُ أَتَانِي فَقَالَ: مَنْ صَلَّى عَلَيْكَ وَاحِدَةً صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ عَشْرًا وَرَفَعَهُ عَشْرَ دَرَجَاتٍ))[(١)].

له ئەنەسی کوڕی مالکەوە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ چوو بۆ سەرئاو کەسی نەبینی شوێنی بکەوێت، عومەر رضي الله عنه ڕاپەڕی و شوێنیکەوت بە مەسینەیەك ئاوەوە، بینی لە ڕاڕەوی ئاوی بنی دار خورمایەکدا لە سوژدەدایە، عومەر خۆی لادا و لە پشتییەوە دانیشت هەتاکو سەری بەرزکردەوە، عومەر رضي الله عنه گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ

(١). (إسناده ضعيف)، لكن المرفوع من الحديث صحيح، له شواهيد كثيرة؛ وقال في (في صحيح الأدب المفرد)(٤٩٩): حسن.

فەرمووی: کارێی باشت کرد کاتێك بینیت لە سوژدەدام و خۆت لادا، جبریل عليه السلام هات بۆ لام فەرمووی: هەرکەسێك یەك سەڵەواتت لەسەر بدات، خوا دە سەڵەواتی لەسەر دەدات و دە پلە بەرزی دەکاتەوە.



٥. ٦. عَنْ عَامِرِ بْنِ رَبِيعَةَ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: ((مَا مِنْ عَبْدٍ يُصَلِّي عَلَيَّ إِلَّا صَلَّتْ عَلَيْهِ الْمَلَائِكَةُ مَا صَلَّى عَلَيَّ، فَلْيُقِلَّ مِنْ ذَلِكَ أَوْ لِيُكْثِرْ))[1].

لە عامری کوڕی ڕەبیعەوە رضي الله عنه دەڵێت: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: هیچ بەندەیەك نییە سەڵەواتم لەسەر بدات، ئیللا

---

(١). (إسناده ضعيف) وقد رواه أحمد وابن أبي شيبة وابن ماجة وغيرهم، يشهد له الحديث الثالث، فالحديث حسن على الأقل.

فریشتە سەڵەواتی لەسەر دەدەن هەتا سەڵەواتم لەسەر بدات، با ژمارەی سەڵەواتەکانی زیاد بکات یان کەمی بکات.



٦. ٧ عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ وَهُوَ سَاجِدٌ فَأَطَالَ السُّجُودَ، قَالَ: ((أَتَانِي جِبْرِيلُ قَالَ: مَنْ صَلَّى عَلَيْكَ صَلَّيْتُ عَلَيْهِ، وَمَنْ سَلَّمَ عَلَيْكَ سَلَّمْتُ عَلَيْهِ، فَسَجَدْتُ لِلَّهِ شُكْرًا)).

له عبدالرحمانی کوڕی عەوفەوە رضي الله عنه دەڵێت: ڕۆیشتم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ لە سوژدەدا بوو، سوژدەکەی درێژکردەوە، فەرمووی: جبریل عليه السلام هات بۆ لام فەرمووی: هەرکەسێك سەڵەواتت لەسەر بدات من سەڵەواتی لەسەر دەدەم، و هەرکەسێك سەلامت لێ بکات من سەلامی لێ دەکەم، بەو هۆیەوە سوژدەی شوکرم بۆ خوای پەروەردگار برد.



٧. ٩. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: ((مَنْ صَلَّى عَلَيَّ وَاحِدَةً، صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ عَشْرًا)).

لە ئەبوهورەیرەوە رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەرکەسێك یەك سەڵەواتم لەسەر بدات، خوا دە سەڵەواتی لەسەر دەدات.



٨. ١٠. عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ قَالَ: ((كَانَ لَا يُفَارِقُ فَيْءَ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ خَمْسَةُ نَفَرٍ مِنْ أَصْحَابِهِ أَوْ أَرْبَعَةٌ لِمَا يَنُوبُهُ مِنْ حَوَائِجِهِ؛ قَالَ: فَجِئْتُ فَوَجَدْتُهُ قَدْ خَرَجَ فَتَبِعْتُهُ فَدَخَلَ حَائِطًا مِنْ حِيطَانِ الْأَسْوَافِ، فَصَلَّى فَسَجَدَ سَجْدَةً أَطَالَ فِيهَا فَحَزِنْتُ وَبَكَيْتُ، فَقُلْتُ: لَأَرَى رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَدْ قَبَضَ اللَّهُ رُوحَهُ، قَالَ: فَرَفَعَ رَأْسَهُ وَتَرَاءَيْتُ لَهُ فَدَعَانِي فَقَالَ: مَا لَكَ؟، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ سَجَدْتَ

سَجْدَةً أَطَلْتَ فِيهَا فَحَزِنْتُ وَبَكَيْتُ وَقُلْتُ: لَأَرَى رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَدْ قَبَضَ اللَّهُ رُوحَهُ قَالَ: هَذِهِ سَجْدَةٌ سَجَدْتُهَا شُكْرًا لِرَبِّي فِيمَا آتَانِي فِي أُمَّتِي، مَنْ صَلَّى عَلَيَّ صَلَاةً كَتَبَ اللَّهُ لَهُ عَشْرَ حَسَنَاتٍ)).

له عبدالرحمانی کوڕی عەوفەوە رضي الله عنه دەڵێت: چوار یان پێنج کەس لە هاوەڵانی وەك سێبەر لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ بوون لێی جیانەبوونەوە، بۆ ڕاپەڕاندنی ئیشوکاری، دەڵێت: هاتم بۆ لای بینیم دەرچووە چووە باخێکەوە لە باخەکانی ئەو شوێنەی بە حەرەم دیاری کردبوو (الأسواف)[١] شوێنی کەوتم، دەستی بە نوێژکردن کرد سوژدەیەکی برد زۆر سوژدەکەی درێژکردەوە خەمباربووم و دەستم بەگریان کرد، گوتم: وادەبینم پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆحی کێشراوە و

(١). ئەلبانی دەڵێت: ناوی حەرەمی مەدینەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ حەرامی کردووە.(نهاية)؛ و لە (اللسان)دا ئەمەی بۆ زیادکردووە: و گوتراوە: شوێنێکی دیاریکراوە لە لای بەقیع.

وەفاتی کردووە، سەری بەرزکردەوە خۆم پیشانیدا بانگی کردم، فەرمووی: ئەوە چیتە؟ گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا سوژدەیەکت برد زۆر سوژدەکەت درێژکردەوە خەمباربووم و گریام، و گوتم: وادەبینم ڕۆحی پێغەمبەری خوا کێشراوە و وەفاتی کردووە، فەرمووی: ئەو سوژدەیەم برد بۆ پەروەردگار لەبەر ئەوەی بۆ ئوممەتەکەم پێی بەخشیوم، هەرکەسێك سەڵەواتێکم لەسەر بدات خوا دە چاکەی بۆ دەنوسێت.

❁ ❁ ❁

٩. ١١. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: ((مَنْ صَلَّى عَلَيَّ مَرَّةً وَاحِدَةً كَتَبَ اللَّهُ لَهُ عَشْرَ حَسَنَاتٍ)).

لە ئەبوهورەیرەوە رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: هەرکەسێك یەکجار سەڵەواتم لەسەر بدات خوا دە چاکەی بۆ دەنوسێت.

❁ ❁ ❁

١٠. ١٣. عَنْ يَعْقُوبَ بْنِ زَيْدِ بْنِ طَلْحَةَ التَّيْمِيِّ قَالَ: ((قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَتَانِي آتٍ مِنْ رَبِّي فَقَالَ: مَا مِنْ عَبْدٍ يُصَلِّي عَلَيْكَ صَلَاةً إِلَّا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ بِهَا عَشْرًا؛ فَقَامَ إِلَيْهِ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَجْعَلُ نِصْفَ دُعَائِي لَكَ؟ قَالَ: إِنْ شِئْتَ، قَالَ: أَلَا أَجْعَلُ ثُلُثَيْ دُعَائِي لَكَ؟ قَالَ: إِنْ شِئْتَ؛ قَالَ: أَلَا أَجْعَلُ دُعَائِي لَكَ كُلَّهُ؟ قَالَ: إِذَنْ يَكْفِيكَ اللَّهُ هَمَّ الدُّنْيَا، وَهَمَّ الْآخِرَةِ)).

لەیەعقوبی کوڕی زەیدی کوڕی تەڵحەی تەیمییەوە رحمه الله دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: فریشتەیەك لای پەروەردگارمەوە هات بۆ لام، فەرمووی: هیچ بەندەیەك نییە یەك سەڵەواتت لەسەر بدات ئیللا خوا دە سەڵەواتی لەسەر دەدات، پیاوێك هەستا چوو بۆ لای گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا من نیوەی دوعاکانم تایبەت دەکەم بۆ سەڵەواتدان لەسەر تۆ؟، فەرمووی: بە ویستی خۆت، گوتی: ئایا دوو لە سێ دوعاکانم تایبەت بکەم بۆ سەڵەواتدان لەسەر تۆ؟، فەرمووی: بە ویستی

خۆت، گوتی: ئایا هەموو دوعاکەم سەڵەوات لەسەر تۆ بدەم؟ فەرمووی: ئەو کاتە خوات بەسە بۆ ئەوەی لە پێشتە لە خەم و پەژارەی دونیا، و خەم و پەژارەی قیامەت[١].



١١. ١٤. عَنِ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ قَالَ: ((كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَخْرُجُ فِي ثُلُثَيِ اللَّيْلِ فَيَقُولُ: جَاءَتِ الرَّاجِفَةُ تَتْبَعُهَا الرَّادِفَةُ، جَاءَ الْمَوْتُ بِمَا فِيهِ، وَقَالَ أُبَيٌّ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي أُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ أَفَأَجْعَلُ لَكَ ثُلُثَ صَلَاتِي قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: الشَّطْرُ، قَالَ: أَفَأَجْعَلُ لَكَ شَطْرَ صَلَاتِي قَالَ رَسُولُ اللَّهِ: الثُّلُثَانِ أَكْثَرُ، قَالَ: أَفَأَجْعَلُ لَكَ صَلَاتِي كُلَّهَا؟ قَالَ: إِذَنْ يُغْفَرُ لَكَ ذَنْبُكَ كُلُّهُ)).

---

(١). هذا مرسل صحيح الإسناد، ويشهد له ما بعده.

لە ئوبەی کوڕی کەعبەوە رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك دوو بەش لە سێ بەشی شەو تێپەڕیایە لە ماڵ دەردەچوو و دەیفەرموو: ئەو کاتە هات کە زەوی دەهەژێت چی هەژانێك، لەرزان و هەژانێکی تری بە دوادا دێت؛ ئەوە مردن و هەموو ئەو ناڕەحەتییانەی تێیدایە بەسەردا هات؛ ئوبەی گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا من لە شەودا نوێژ دەکەم، ئایا سێیەکی نوێژەکەم تەرخان بکەم بۆ سەڵەواتدان لەسەر تۆ؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بیکە بە نیوە، گوتی: ئایا نیوەی نوێژەکەم تەرخان بکەم بۆ سەڵەواتدان لەسەر تۆ؟ فەرمووی: دوو بەش لە سێ بەش زیاترە، گوتی: ئایا هەموو نوێژەکەم تەرخان بکەم بۆ سەڵەواتدان لەسەر تۆ؟ فەرمووی: ئەو کاتە خوا هەموو تاوانەکانت دەپۆشێت و لێت خۆش دەبێت.

❁ ❁ ❁

١٢. ١٥. عَنْ أَنَس بْن مَالِك يَقُولُ: ((ارْتَقَى النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى الْمِنْبَرِ دَرَجَةً فَقَالَ: آمِينَ، ثُمَّ ارْتَقَى الثَّانِيَةَ فَقَالَ: آمِينَ، ثُمَّ ارْتَقَى الثَّالِثَةَ فَقَالَ: آمِينَ، ثُمَّ اسْتَوَى فَجَلَسَ، فَقَالَ أَصْحَابُهُ: عَلَامَ أَمَّنْتَ؟ قَالَ: أَتَانِي جِبْرِيلُ فَقَالَ: رَغِمَ أَنْفُ امْرِئٍ ذُكِرْتَ عِنْدَهُ فَلَمْ يُصِلِّ عَلَيْكَ، فَقُلْتُ: آمِينَ، فَقَالَ: رَغِمَ أَنْفُ امْرِئٍ أَدْرَكَ أَبَوَيْهِ فَلَمْ يَدْخُلِ الْجَنَّةَ، فَقُلْتُ: آمِينَ، فَقَالَ: رَغِمَ أَنْفُ امْرِئٍ أَدْرَكَ رَمَضَانَ فَلَمْ يُغْفَرْ لَهُ، فَقُلْتُ: آمِينَ)).

لە ئەنەسی کوڕی مالك رضي الله عنه گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ یەك پلە چووە سەر مینبەرەکەی و فەرمووی: ئامین، پاشان سەرکەوت بەسەر پلەی دووەمدا و فەرمووی: ئامین، پاشان سەرکەوت بەسەر پلەی سێیەمدا و فەرمووی: ئامین، پاشان لەسەر مینبەرەکەی دانیشت، هاوەڵانی گوتیان: بۆچی ئامینت کرد؟ فەرمووی: جبریل هات بۆ لام فەرمووی: لووتی بە خاکدا بچێت ئەو کەسەی ناوی تۆ لای بهێنرێت و سەڵەواتت لەسەر نەدات، لە وەڵامیدا گوتم: ئامین، فەرمووی: لووتی بە

خاکدا بچێت ئەو کەسەی دایك و باوکی لای گەورەبن و بەهۆی چاکەکردنی لەگەڵیان نەچێتە بەهەشتەوە، لە وەڵامیدا گوتم: ئامین، فەرمووی: لووتی بە خاکدا بچێت ئەو کەسەی بگاتە مانگی ڕەمەزان خوا لە تاوانەکانی خۆش نەبێت، لە وەڵامیدا گوتم: ئامین.



١٣. ١٦. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : ((رَغِمَ أَنْفُ رَجُلٍ ذُكِرْتُ عِنْدَهُ فَلَمْ يُصَلِّ عَلَيَّ، وَرَغِمَ أَنْفُ رَجُلٍ أَدْرَكَ أَبَوَيْهِ عِنْدَ الْكِبَرِ فَلَمْ يُدْخِلَاهُ الْجَنَّةَ، وَرَغِمَ أَنْفُ رَجُلٍ دَخَلَ عَلَيْهِ رَمَضَانُ ثُمَّ انْسَلَخَ قَبْلَ أَنْ يُغْفَرَ لَهُ)).

لە ئەبوهورەیرەوە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: لووتی بە خاکدا بچێت ئەو کەسەی ناوی من لای بهێنرێت و سەڵەواتم لەسەر نەدات، لووتی بە خاکدا بچێت ئەو کەسەی دەگاتە تەمەنی پیری

دایك و باوکی و نەیبەنە بەهەشتەوە، لووتی بە خاکدا بچێت ئەو کەسەی مانگی ڕەمەزانی بەسەردا بێت، پاشان پێش ئەوەی مانگەکە کۆتای بێت خوا لە تاوانەکانی خۆش نەبووبێت.



١٤. ٢٠. عَنْ عَلِيِّ بْنِ حُسَيْنِ بْنِ عَلِيّ أَنَّ رَجُلًا، كَانَ يَأْتِي غَدَاةً فَيَزُورُ قَبْرَ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَيُصَلِّي عَلَيْهِ وَيَصْنَعُ مِنْ ذَلِكَ مَا اشْتَهَرَهُ عَلَيْهِ عَلِيُّ بْنُ الْحُسَيْنِ، فَقَالَ لَهُ عَلِيُّ بْنُ الْحُسَيْنِ: مَا يَحْمِلُكَ عَلَى هَذَا؟ قَالَ: أُحِبُّ التَّسْلِيمَ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ لَهُ عَلِيُّ بْنُ الْحُسَيْنِ: هَلْ لَكَ أَنْ أُحَدِّثَكَ حَدِيثًا عَنْ أَبِي؟ قَالَ: نَعَمْ، فَقَالَ لَهُ عَلِيُّ بْنُ حُسَيْنٍ: أَخْبَرَنِي أَبِي عَنْ جَدِّي أَنَّهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ: ((لَا تَجْعَلُوا قَبْرِي عِيدًا وَلَا تَجْعَلُوا بُيُوتَكُمْ قُبُورًا، وَصَلُّوا عَلَيَّ وَسَلِّمُوا حَيْثُمَا كُنْتُمْ فَسَيَبْلُغُنِي سَلَامُكُمْ وَصَلَاتُكُمْ)).

لە عەلی کوڕی حوسەینی کوڕی عەلییەوە رحمه الله: پیاوێك هەموو بەیانییەك دەهات زیارەتی قەبری پێغەمبەری خوای ﷺ دەکرد و سەڵەواتی لەسەر دەدا، و ئەوەی دەکرد هەتاکو لێیەوە بڵاوبوویەوە، عەلی کوڕی حوسەین پێیگوت: چی پاڵنەرتە ئەم کارە بکەیت؟ گوتی: پێم خۆشە سەلام لە پێغەمبەری خوا ﷺ بکەم، عەلی کوڕی حوسەین پێیگوت: ئایا دەتەوێت فەرموودەیەکت بۆ بێگرمەوە لە باوکمەوە؟ گوتی: بەڵێ، عەلی کوڕی حوسەین گوتی: باوکم لە باپیرمەوە بۆیگێڕامەوە گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: گۆڕەکەم مەکەنە شوێنی بۆنە و جەژن وماڵەکانتان مەکەنە گۆڕستان، سەڵەوات و سەلامم لەسەر بدەن لە هەرکوێ بوون سەلام و سەڵاواتتان بەمن دەگەیەنرێت.



١٥. ٢١. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ هُوَ ابْنُ مَسْعُودٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: ((إِنَّ لِلَّهِ فِي الْأَرْضِ مَلَائِكَةً سَيَّاحِينَ يُبَلِّغُونِي مِنْ أُمَّتِي السَّلَامَ)).

له عبداللەی کوڕی مەسعودەوە رضي الله عنه لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: بێگومان خوای پەروەردگار کۆمەڵە فریشتەیەکی هەیە بەسەر زەویدا دەگەڕێن، سەلامی ئوممەتەکەم پێ دەگەیەنن.



١٦. ٢٢. عَنْ أَوْسِ بْنِ أَوْسٍ: ((أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِنَّ مِنْ أَفْضَلِ أَيَّامِكُمْ يَوْمَ الْجُمُعَةِ؛ فِيهِ خُلِقَ آدَمُ، وَفِيهِ قُبِضَ، وَفِيهِ النَّفْخَةُ، وَفِيهِ الصَّعْقَةُ، فَأَكْثِرُوا عَلَيَّ مِنَ الصَّلَاةِ فَإِنَّ صَلَاتَكُمْ مَعْرُوضَةٌ عَلَيَّ، قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ كَيْفَ تُعْرَضُ عَلَيْكَ صَلَاتُنَا وَقَدْ أَرِمْتَ؟ ـ يَقُولُونَ: قَدْ بَلِيتَ ـ قَالَ: إِنَّ اللَّهَ حَرَّمَ عَلَى الْأَرْضِ أَنْ تَأْكُلَ أَجْسَادَ الْأَنْبِيَاءِ)).

لە ئەوسی کوڕی ئەوسەوە رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: لە باشترین ڕۆژەکانتان ڕۆژی جومعەیە، پێغەمبەر ئادەمی تێدا دروستکراوە، و تێدا ڕۆحی کێشراوە، و لە ڕۆژی جومعە فوو دەکرێت بە شەیپوردا، و دەنگە ترسناکەکەی تێدایە، لە ڕۆژی جومعەدا زۆر سەڵاواتم لەسەر بدەن، چونکە سەڵەواتەکانتان عەرز دەکرێت بەسەرمدا، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا چۆن عەرز دەکرێت بەسەرتدا لە کاتێکدا ڕزیویت؟، فەرمووی: بێگومان خوا حەرامی کردووە لەسەر زەوی جەستەی پێغەمبەران بڕزێنێت.



١٧. ٢٣. عَنْ الْحَسَن يَقُولُ: قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: ((لَا تَأْكُلُ الْأَرْضُ جَسَدَ مَنْ كَلَّمَهُ رُوحُ الْقُدُسِ)).

لە حەسەنی بەسرییەوە رحمه الله دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمویێت: زەوی جەستەی هیچ کەسێك ناخوات کە جبریل عليه السلام قسەی لەگەڵدا کردبێت[1].



١٨. ٢٤. عَنْ أَيُّوبَ قَالَ: ((بَلَغَنِي ـ وَاللَّهُ أَعْلَمُ ـ أَنَّ مَلَكًا مُوَكَّلٌ بِكُلِّ مَنْ صَلَّى عَلَى النَّبِيِّ حَتَّى يُبَلِّغَهُ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)).

لە ئەیوبی سیختیانییەوە رحمه الله دەڵێت: پێمگەیشتووە ـ و خوا زاناترە ـ فریشتەیە ڕاسپێردراوە هەموو کەسێك کە سەڵەوات لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ دەدات، سەڵەواتەکە دەگەیەنێت بە پێغەمبەری خوا ﷺ[2].



---

(١). حديث صحيح بما قبله، وإسناده صحيح مرسل.

(٢). إسناده إلى أيوب صحيح، وهو مرفوع في صورة (مقطوع) لأنه لا يقال بالرأي، ويشهد له الحديث المتقدم(٢١).

١٩. ٢٨. عَنِ الْحَسَنِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: ((أَكْثِرُوا عَلَيَّ الصَّلَاةَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ)).

لە حەسەنی بەسرییەوە رحمه الله دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: لە ڕۆژی جومعەدا زۆر سەڵەواتم لەسەر بدەن[1].



٢٠. ٢٩. عَنِ الْحَسَنِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: ((أَكْثِرُوا عَلَيَّ الصَّلَاةَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ فَإِنَّهَا تُعْرَضُ عَلَيَّ)).

لە حەسەنی بەسرییەوە رحمه الله دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: لە ڕۆژی جومعەدا زۆر سەڵەواتم لەسەر بدەن، چونکە سەڵەواتەکانتان عەرز دەکرێت بەسەرمدا[2].

---

(١). حديث صحيح بشاهده المتقدم(٢٢).

(٢). حديث صحيح كالذي قبله.

٢١. ٣٠. عَنْ سُهَيْلٍ قَالَ: ((جِئْتُ أُسَلِّمُ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَحَسَنُ بْنُ حَسَنٍ يَتَعَشَّى فِي بَيْتٍ عِنْدَ النَّبِيِّ فَدَعَانِي فَجِئْتُهُ فَقَالَ: ادْنُ فَتَعَشَّ قَالَ: قُلْتُ: لَا أُرِيدُهُ، قَالَ: مَالِي رَأَيْتُكَ وَقَفْتَ؟ قَالَ: وَقَفْتُ أُسَلِّمُ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: إِذَا دَخَلْتَ الْمَسْجِدَ فَسَلِّمْ عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: صَلُّوا فِي بُيُوتِكُمْ وَلَا تَجْعَلُوا بُيُوتَكُمْ مَقَابِرَ، لَعَنَ اللَّهُ يَهُودَ اتَّخَذُوا قُبُورَ أَنْبِيَائِهِمْ مَسَاجِدَ، وَصَلُّوا عَلَيَّ، فَإِنَّ صَلَاتَكُمْ تَبْلُغُنِي حَيْثُمَا كُنْتُمْ)).

لە سوهەیلەوە ﵀ دەڵێت: ڕۆیشتم سەلام لە پێغەمبەری خوا ﷺ بکەم، حەسەنی کوڕی حەسەن لە ماڵێك لای پێغەمبەری خوا ﷺ نانی ئێوارەی دەخوارد، بانگیکردم ڕۆیشت بۆ لای گوتی: نزیکبەرەوە نانی ئێوارە بخۆ، گوتم: نان ناخۆم، گوتی: ئەوە چی بوو بینیم وەستایت؟، گوتم: وەستام بۆ ئەوەی سەلام لە پێغەمبەری خوا ﷺ بکەم، گوتی: ئەگەر لە مزگەوت چوویتە ژوورەوە سەلامی لێ بکە، پاشان گوتی:

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نوێژ لە ماڵەکانتان بکەن و ماڵەکانتان مەکەنە گۆڕستان، نەفرەتی خوا لە جوولەکە گۆڕی پێغەمبەرەکانیان کردە مزگەوت، و سەڵەواتم لەسەر بدەن، چونکە بێگومان سەڵەواتەکانت پێم دەگات لە هەر کوێبن.



٢٢. ٣١. عَنْ عَلِيِّ بْنِ حُسَيْنٍ، عَنْ أَبِيهِ: ((أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِنَّ الْبَخِيلَ لَمَنْ ذُكِرْتُ عِنْدَهُ فَلَمْ يُصَلِّ عَلَيَّ)).

لە عەلی کوڕی حوسەینەوە لە باوکییەوە رحمه الله: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: بەڕاستی بەخیل و ڕژد ئەو کەسەیە ناوی منی لادا بهێنرێت سەڵەواتم لەسەر نەدات.



٢٣. ٣٧. عَنْ أَبِي ذَرّ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: ((إِنَّ أَبْخَلَ النَّاسِ مَنْ ذُكِرْتُ عِنْدَهُ فَلَمْ يُصَلِّ عَلَيَّ)).

له ئەبوزەڕەوە رضي الله عنه: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: بێگومان بەخیل و ڕژدترین کەس ئەو کەسەیە ناوی منی لادا بهێنرێت سەڵەواتم لەسەر نەدات.



٢٤. ٣٨. عَنْ الْحَسَنَ: يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: ((بِحَسْبِ امْرِئٍ فِي الْبُخْلِ أَنْ أُذْكَرَ عِنْدَهُ فَلَا يُصَلِّي عَلَيَّ)).

له حەسەنی بەسرییەوە رحمه الله دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: بەسە بۆ ئەوەی مرۆڤ بەخیل و ڕژدبێت ناوی منی لادا بهێنرێت سەڵەواتم لەسەر نەدات[١].

---

(١). إسناده مرسل صحيح، ويشهد له ما قبله.

٢٥. ٤١. عَنْ جَعْفَرٍ عَنْ أَبِيهِ: ((أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ يَنْسَى الصَّلَاةَ عَلَيَّ خَطِئَ أَبْوَابَ الْجَنَّةِ)).

له جەعفەرەوە له باوكییەوە رحمه الله دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: هەركەسێك سەڵەواتدان لەسەر من له بیر بكات، دەرگاكانی بەهەشت هەڵە دەكات[1].



٢٦. ٤٢. عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَلِيِّ بْنِ حُسَيْنٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: ((مَنْ يَنْسَى الصَّلَاةَ عَلَيَّ خَطِئَ طَرِيقَ الْجَنَّةِ)).

له محمدی كوڕی عەلی كوڕی حوسەینەوە رحمه الله دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: هەركەسێك سەڵاواتدان لەسەرم له بیر بكات، ڕێگای بەهەشت هەڵە دەكات.



---

(١). إسناده مرسل جيد.

٢٧. ٤٩. عَنْ أَبي سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: ((إِنَّ الْوَسِيلَةَ دَرَجَةٌ عِنْدَ اللَّهِ لَيْسَ فَوْقَهَا دَرَجَةٌ، فَسَلُوا اللَّهَ أَنْ يُؤْتِيَنِي الْوَسِيلَةَ عَلَى خَلْقِهِ)).

له ئەبوسەعیدی خودرییەوە رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: وەسیله پلەیەکه لای خوای پەروەردگار هیچ پلەیەك لەسەرووییەوە نییە، داوا له خوا بکەن ئەو پلەیە بە من ببەخشێت له نێو هەموو بەندەکانی.



٢٨. ٥٠. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: ((مَنْ صَلَّى عَلَيَّ أَوْ سَأَلَ لِيَ الْوَسِيلَةَ، حَقَّتْ عَلَيْهِ شَفَاعَتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ)).

له عبداللەی کوڕی عەمرەوە رضي الله عنهما دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: هەر کەسێك سەڵەواتم لەسەر بدات یان داوای وەسیلەم بۆ بکات، شایستەی شەفاعەتی من دەبێت له ڕۆژی قیامەتدا.

٢٩. ٥٢. عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ يَقُولُ: (اللَّهُمَّ تَقَبَّلْ شَفَاعَةَ مُحَمَّدٍ الْكُبْرَى، وَارْفَعْ دَرَجَتَهُ الْعُلْيَا وَأَعْطِهِ سُؤْلَهُ فِي الْآخِرَةِ وَالْأُولَى كَمَا آتَيْتَ إِبْرَاهِيمَ وَمُوسَى عَلَيْهِمُ السَّلَامُ).

له ئیبن عەباسەوە رضي الله عنهما دەیگوت: پەروەردگارا شەفاعەتی گەورەی محمد قەبوڵ بکە، و پلەوپایەی بەرز بکەرەوە، و داواکارییەکانی دونیا و قیامەتی پێ ببەخشە، وەك چۆن بەخشیت بە پێغەمبەران ئیبراهیم و موسا عليهما السلام[1].



٣٠. ٥٤. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: ((مَا جَلَسَ قَوْمٌ مَجْلِسًا لَمْ يَذْكُرُوا اللَّهَ، وَلَمْ يُصَلُّوا عَلَى نَبِيِّهِمْ، إِلَّا كَانَ مَجْلِسُهُمْ عَلَيْهِمْ تِرَةً يَوْمَ الْقِيَامَةِ، إِنْ شَاءَ عَفَا عَنْهُمْ وَإِنْ شَاءَ أَخَذَهُمْ)).

---

(١). إسناده صحيح موقوف.

لە ئەبوهورەیرەوە رضي الله عنه دەڵێت: پـێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: هیچ کۆمەڵە کەسێك نییە پێکەوە دابنیشن زیکری خوا نەکەن، و سەڵەوات لەسەر پێغەمبەرەکەیان نەدەن، ئیللا ئەو دانیشتنەیان دەبێتە حەسرەت و پەشیمانی بۆیان لە ڕۆژی قیامەتدا، ئەگەر خوای پەروەردگار بیەوێت لێیان دەبورێت، و ئەگەر بیەوێت سزایان دەدات.



٣١. ٥٥. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ قَالَ: (مَا مِنْ قَوْمٍ يَقْعُدُونَ ثُمَّ يَقُومُونَ وَلَا يُصَلُّونَ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، إِلَّا كَانَ عَلَيْهِمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ حَسْرَةً، وَإِنْ دَخَلُوا الْجَنَّةَ لِلثَّوَابِ[1]).

---

(١). قال الألباني: ظاهره في كون تارك الذكر والصلاة عليه ﷺ، يستحق دخول النار، وإن كان مصيره إلى الجنة ثوابا على إيمانه. (الصحيحة)(١/١٦٢).

لە ئەبوسەعیدی خودرییەوە رضي الله عنه دەڵێت: هیچ کۆمەڵێك نییە دابنیشن پاشان هەستن و سەڵەوات لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ نەدەن، ئیللا ئەو دانیشتنەیان دەبێتە حەسرەت بۆیان لە ڕۆژی قیامەتدا، ئەگەر بچنە بەهەشتیشەوە لە پاداشتی باوەڕەکەیان[1].



٣٢. ٥٦. عَنِ ابْنِ أَبِي لَيْلَى عَنْ كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ أَنَّهُ قَالَ: ((أَلَا أُهْدِي لَكَ هَدِيَّةً؟ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَرَجَ عَلَيْنَا، قَالَ: فَقُلْنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ قَدْ عَلِمْنَا كَيْفَ نُسَلِّمُ عَلَيْكَ فَكَيْفَ نُصَلِّي؟ قَالَ: قُولُوا: اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ)).

---

(١). إسناده صحيح موقوف، ولكنه في حكم المرفوع، لا سيما وقد جاء مرفوعا.

لە ئیبن ئەبولەیلاوە لە کەعبی کوڕی عوجرەوە رضي الله عنه گوتی: ئایا دیارییەکت پێ ببەخشم؟ پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ لامان گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا زانیمان چۆن سەلامت لێ دەکەین، ئەی چۆن سەڵەواتت لەسەر بدەین؟ فەرمووی: بڵێن: ((اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ)).



٣٣. ٥٩. عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: ((أَتَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ رَجُلٌ حَتَّى جَلَسَ بَيْنَ يَدَيْهِ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ أَمَّا السَّلَامُ عَلَيْكَ فَقَدْ عَرَفْنَاهُ، وَأَمَّا الصَّلَاةُ فَأَخْبِرْنَا بِهَا، كَيْفَ نُصَلِّي عَلَيْكَ؟ قَالَ: فَصَمَتَ رَسُولُ اللَّهِ حَتَّى وَدِدْنَا أَنَّ الرَّجُلَ الَّذِي سَأَلَهُ لَمْ يَسْأَلْهُ، ثُمَّ قَالَ: إِذَا صَلَّيْتُمْ عَلَيَّ فَقُولُوا: اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ النَّبِيِّ الْأُمِّيِّ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ

وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ وَبَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ النَّبِيِّ الْأُمِّيِّ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا بَارَكْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ)).

له عوقبەی کوڕی عەمرەوە رضي الله عنه دەڵێت: پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ هەتا له بەردەستیدا دانیشت، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا زانیمان چۆن سەلامت لێ بکەین، باسمان بۆ بکە چۆن سەڵەواتت لەسەر بدەین ؟، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ بێدەنگ بوو هەتا خۆزگەمان خواست ئەو پیاوە پرسیاری لێ نەکردایە، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر سەڵەواتتان لەسەردام بڵێن: ((اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ النَّبِيِّ الْأُمِّيِّ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، وَبَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ النَّبِيِّ الْأُمِّيِّ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا بَارَكْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ)).



٣٤. ٦٠. عَنْ زَيْدِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ: (أَنَّهُمْ كَانُوا يَسْتَحِبُّونَ أَنْ يَقُولُوا: اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ النَّبِيِّ الْأُمِّيِّ، عَلَيْهِ السَّلَامُ).

له زەیدی کوڕی عبداللەوە رحمه الله: پێیان خۆشبوو بڵێن: (اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ النَّبِيِّ الْأُمِّيِّ عليه السلام)[1].



٣٥. ٦٣. عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الْأَنْصَارِيِّ قَالَ: ((أَتَانَا رَسُولُ اللَّهِ فِي مَجْلِسِ سَعْدِ بْنِ عُبَادَةَ، فَقَالَ بَشِيرُ بْنُ سَعْدٍ: أَمَرَنَا اللَّهُ أَنْ نُصَلِّيَ عَلَيْكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ فَكَيْفَ نُصَلِّي عَلَيْكَ؟، قَالَ: فَسَكَتَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَتَّى تَمَنَّيْنَا أَنَّهُ لَمْ يَسْأَلْهُ، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: قُولُوا: اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ،

---

(١). إسنادة صحيح وهو مقطوع، فإن زيد بن عبدالله من طبقة التابعين.

وَبَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا بَارَكْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ فِي الْعَالَمِينَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ، وَالسَّلَامُ كَمَا عَلِمْتُمْ)).

له ئەبومەسعودی ئەنصارییەوە رضي الله عنه دەڵێت: له کۆڕی سەعدی کوڕی عوبادەدا دانیشتبووین پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ لامان، بەشیری کوڕی سەعد گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، خوا فەرمانی پێکردووین سەڵەواتت لەسەر بدەین، چۆن سەڵەواتت لەسەر بدەین؟ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ بێدەنگ بوو هەتا خۆزگەمان خواست پرسیاری لێ نەکردایە، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بڵێن: ((اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، وَبَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا بَارَكْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ فِي الْعَالَمِينَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ))، و سەلام بەوشێوەیە کە دەیزانن.



٣٦. ٦٤. عَنْ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: ((قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ: قَدْ عَلِمْنَا السَّلَامَ عَلَيْكَ، فَكَيْفَ الصَّلَاةُ عَلَيْكَ؟، قَالَ: قُولُوا: اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى عَبْدِكَ وَرَسُولِكَ وَأَهْلِ بَيْتِهِ كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ، وَبَارِكْ عَلَيْهِ وَأَهْلِ بَيْتِهِ كَمَا بَارَكْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ)).

لە ئیبراهیمی کوڕی یەزیدی نەخعییەوە رحمه الله دەڵێت: گوتیان ئەی پێغەمبەری خوا: زانیمان چۆن سەلامت لێ بکەین، بەڵام چۆن سەڵەواتت لەسەر بدەین؟ فەرمووی: بڵێن: ((اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى عَبْدِكَ وَرَسُولِكَ وَأَهْلِ بَيْتِهِ كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ، وَبَارِكْ عَلَيْهِ وَأَهْلِ بَيْتِهِ كَمَا بَارَكْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ))[١].



(١). إسناده مرسل صحيح.

٣٧. ٦٥. عَنْ الْحَسَنَ قَالَ: ((لَمَّا نَزَلَتْ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ وَمَلَٰٓئِكَتَهُۥ يُصَلُّونَ عَلَى ٱلنَّبِيِّۚ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ صَلُّواْ عَلَيۡهِ وَسَلِّمُواْ تَسۡلِيمًا ٥٦﴾(الأحزاب)، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ هَذَا السَّلَامُ قَدْ عَلِمْنَا كَيْفَ هُوَ، فَكَيْفَ تَأْمُرُنَا أَنْ نُصَلِّيَ عَلَيْكَ؟ قَالَ: تَقُولُونَ: اللَّهُمَّ اجْعَلْ صَلَوَاتِكَ وَبَرَكَاتِكَ عَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا جَعَلْتَهَا عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ)).

له حەسەنی بەسرییەوە ﷺ دەڵێت: کاتێك ئەم ئایەتە دابەزی: بێگومان خوا و فریشتەکانی سەڵەوات دەدەن لەسەر پێغەمبەرەکەی، ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە سەڵەواتی لەسەر بدەن و سەلامی لێبکەن بە سەلامی ئیسلام؛ گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا زانیمان سەلام لێکردنت چۆنە، چۆن فەرمانمان پێدەکەیت سەڵەواتت لەسەر بدەین؟، فەرمووی: بڵێن: ((اللَّهُمَّ اجْعَلْ صَلَوَاتِكَ وَبَرَكَاتِكَ عَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا جَعَلْتَهَا عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ))[١].



---

(١). إسناده مرسل صحيح.

٣٨. ٦٦. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ: ((قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ هَذَا السَّلَامُ عَلَيْكَ قَدْ عَرَفْنَاهُ فَكَيْفَ الصَّلَاةُ؟، قَالَ: تَقُولُونَ: اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ عَبْدِكَ وَرَسُولِكَ كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ وَبَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا بَارَكْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ)).

له ئەبوسەعیدی خودرییەوە رضي الله عنه دەڵێت: گوتیان: زانیمان چۆن سەلامت لێ بکەین، بەڵام چۆن سەڵەواتت لەسەر بدەین؟، فەرمووی: بڵێن: ((اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ عَبْدِكَ وَرَسُولِكَ كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ وَبَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا بَارَكْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ)).

٣٩. ٧٠. عَنْ أَبِي حُمَيْدٍ السَّاعِدِيُّ أَنَّهُمْ قَالُوا: ((يَا رَسُولَ اللَّهِ كَيْفَ نُصَلِّي عَلَيْكَ؟، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قُولُوا: اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَأَزْوَاجِهِ وَذُرِّيَّتِهِ كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، وَبَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَأَزْوَاجِهِ كَمَا بَارَكْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ)).

لە ئەبوحومەیدی ساعیدییەوە رضي الله عنه گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا چۆن سەڵەواتت لەسەر بدەین؟، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بڵێن: ((اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَأَزْوَاجِهِ وَذُرِّيَّتِهِ كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، وَبَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَأَزْوَاجِهِ كَمَا بَارَكْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ)).



٤٠. ٧٥. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: (لَا تُصَلُّوا صَلَاةً عَلَى أَحَدٍ إِلَّا عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَلَكِنْ يُدْعَى لِلْمُسْلِمِينَ وَالْمُسْلِمَاتِ بِالِاسْتِغْفَارِ).

لە ئیبن عەباسەوە رضي الله عنهما دەڵێت: سەڵەوات لەسەر کەس مەدەن جگە لە پێغەمبەری خوا ﷺ، بەڵام داوای پۆشینی تاوان و لێخۆشبوون دەکرێت بۆ موسڵمانان بە پیاوان و ئافرەتانەوە.



٤١. ٧٦. عَنْ جَعْفَرِ بْنِ بُرْقَانَ قَالَ: كَتَبَ عُمَرُ بْنُ عَبْدِ الْعَزِيزِ: ((أَمَّا بَعْدُ، فَإِنَّ أُنَاسًا مِنَ النَّاسِ قَدِ الْتَمَسُوا الدُّنْيَا بِعَمَلِ الْآخِرَةِ، وَإِنَّ النَّاسَ مِنَ الْقُصَّاصِ قَدْ أَحْدَثُوا فِي الصَّلَاةِ عَلَى خُلَفَائِهِمْ وَأُمَرَائِهِمْ عَدْلَ صَلَاتِهِمْ عَلَى النَّبِيِّ، فَإِذَا جَاءَكَ كِتَابِي هَذَا، فَمُرْهُمْ أَنْ تَكُونَ صَلَاتُهُمْ عَلَى النَّبِيِّينَ وَدُعَاؤُهُمْ لِلْمُسْلِمِينَ عَامَّةً، وَيَدَعُوا مَا سِوَى ذَلِكَ)).

لە جەعفەری کوڕی بورقانەوە دەڵێت: عومەری کوڕی عبدالعزیز ؒ نوسی: أما بعد، کەسانێك داوای دونیا دەکەن بە کردەوەی قیامەت، و کەسانێك کە چیرۆك دەگێڕنەوە هاوتای سەڵەواتدان لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ سەڵەواتیان لەسەر خەلیفە و ئەمیرەکانیان داهێناوە، ئەگەر ئەم نوسراوەی منت پێگەیشت، فەرمانیان پێ بکە سەڵەواتەکانیان تەنها لەسەر پێغەمبەران بدەن و دوعا بۆ تێکڕای موسڵمانان بکەن، و واز لە جگە لەوە بهێنن[١].

---

(١). إسناده صحيح مقطوع.

٤٢. ٧٧ عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ: ((أَنَّ امْرَأَةً قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، صَلِّ عَلَيَّ وَعَلَى زَوْجِي، فَقَالَ: ((صَلَّى اللَّهُ عَلَيْكِ وَعَلَى زَوْجِكِ)).

له جابری کوڕی عبداللەوە رضي الله عنهما: ئافرەتێك گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، سەڵەوات لەسەر من و هاوسەرەکەم بدە، پێغەمبەر خوا ﷺ فەرمووی: خوا سەڵەوات بدات لەسەر تۆ و هاوسەرەکەت.



٤٣. ٧٨ عَنْ أَيُّوبَ عَنْ مُحَمَّدٍ: (أَنَّهُ كَانَ يَدْعُو لِلصَّغِيرِ وَيَسْتَغْفِرُ كَمَا يَدْعُو لِلْكَبِيرِ، فَقِيلَ لَهُ: إِنَّ هَذَا لَيْسَ لَهُ ذَنْبٌ، فَقَالَ: النَّبِيُّ قَدْ غَفَرَ اللَّهُ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ وَمَا تَأَخَّرَ، وَقَدْ أُمِرْتُ أَنْ أُصَلِّيَ عَلَيْهِ).

له ئەیوبی سیختیانییەوە دەڵێت: محمدی کوڕی سیرین، بۆ منداڵ دەپاڕایەوە و داوای لێخۆشبوونی بۆ دەکردن وەك چۆن بۆ گەورە دەپاڕایەوە، پێی گوترا: ئەم منداڵە تاوانی نییە، گوتی: پێغەمبەری خوا

ﷺ خوا له هەڵەکانی ڕابردوو و کۆتایی خۆشبووه، لەگەڵ ئەوەشدا فەرمانم پێکراوه سەڵەواتی لەسەر بدەم.

٤٤. ٨١. عَنْ عُمَر بْن الْخَطَّابِ يَقُولُ: (إِذَا قَدِمْتُمْ فَطُوفُوا بِالْبَيْتِ سَبْعًا، وَصَلُّوا عِنْدَ الْمَقَامِ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ ائْتُوا الصَّفَا، فَقُومُوا مِنْ حَيْثُ تَرَوْنَ الْبَيْتَ، فَكَبِّرُوا سَبْعَ تَكْبِيرَاتٍ بَيْنَ كُلِّ تَكْبِيرَتَيْنِ حَمْدٌ لِلَّهِ، وَثَنَاءٌ عَلَيْهِ، وَصَلَاةٌ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَمَسْأَلَةٌ لِنَفْسِكَ، وَعَلَى الْمَرْوَةِ مِثْلُ ذَلِكَ).

له عومەری کوڕی خەتابەوه رضي الله عنه دەڵێت: ئەگەر ڕۆیشتن بۆ کەعبه حەوت جار تەوافی کەعبه بکەن، و لای مەقامی ئیبراهیم دوو ڕکات نوێژ بکەن، پاشان بڕۆن بۆ سەفا له شوێنێك بوەستن کەعبه ببینن، حەوت جار (الله أكبر) بکه و له نێوان هەموو دوو (الله أكبر)ێك، سوپاس و ستایش و پەسنی خوای پەروەردگار بدەن، و سەڵەوات لەسەر پێغەمبەری خوا بدەن، و بۆ نەفسی خۆت بپاڕێرەوه، و لەسەر مەروەیش به هامان شێوه.

٤٥. ٨٢. عَنْ فَاطِمَةَ بِنْتِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَتْ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: ((إِذَا دَخَلْتِ الْمَسْجِدَ فَقُولِي: بِسْمِ اللَّهِ وَالسَّلَامُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ، اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ، وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، وَاغْفِرْ لَنَا، وَسَهِّلْ لَنَا أَبْوَابَ رَحْمَتِكَ، فَإِذَا فَرَغْتِ، فَقُولِي مِثْلَ ذَلِكَ، غَيْرَ أَنْ تَقُولِيَ: وَسَهِّلْ لَنَا أَبْوَابَ فَضْلِكَ)).

لە فاتمەی کچی پێغەمبەری خواوە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم: ئەگەر ڕۆیشتیتە مزگەوتەوە بڵێ: ((بِسْمِ اللَّهِ وَالسَّلَامُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ، اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ، وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، وَاغْفِرْ لَنَا، وَسَهِّلْ لَنَا أَبْوَابَ رَحْمَتِكَ))، ئەگەر لێ بوویتەوە هەمان زیکر بخوێنە، بەڵام بڵێ: ((وَسَهِّلْ لَنَا أَبْوَابَ فَضْلِكَ)).



٤٦. ٨٨. عَنْ عَلْقَمَةَ، أَنَّ ابْنَ مَسْعُودٍ وَأَبَا مُوسَى وَحُذَيْفَةَ: (خَرَجَ عَلَيْهِمُ الْوَلِيدُ بْنُ عُقْبَةَ قَبْلَ الْعِيدِ يَوْمًا فَقَالَ لَهُمْ: إِنَّ هَذَا الْعِيدَ قَدْ دَنَا فَكَيْفَ التَّكْبِيرُ فِيهِ؟، قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: تَبْدَأُ فَتُكَبِّرُ تَكْبِيرَةً تُفْتَتَحُ بِالصَّلَاةِ، وَتَحْمَدُ رَبَّكَ، وَتُصَلِّي عَلَى النَّبِيِّ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، ثُمَّ تَدْعُو أَوْ تُكَبِّرُ وَتَفْعَلُ مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ تُكَبِّرُ وَتَفْعَلُ مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ تُكَبِّرُ وَتَفْعَلُ مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ تَقْرَأُ ثُمَّ تُكَبِّرُ وَتَرْكَعُ، ثُمَّ تَقُومُ فَتَقْرَأُ وَتَحْمَدُ رَبَّكَ وَتُصَلِّي عَلَى النَّبِيِّ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، ثُمَّ تَدْعُو وَتُكَبِّرُ اللَّهَ وَتَفْعَلُ مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ تُكَبِّرُ وَتَفْعَلُ مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ تَرْكَعُ)، فَقَالَ حُذَيْفَةُ وَأَبُو مُوسَى: صَدَقَ أَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ.

لە عەلقەمەوە رحمه الله دەڵێت: وەلیدی کوڕی عوقبە ڕۆژێك پێش جەژن هات بۆ لای ئیبن مەسعود و ئەبوموسا و حوزەیفە رضي الله عنهم پێی گوتن: ئەوە جەژن نزیکبووەتەوە چۆن تەکبیری تێدا دەکرێت؟، ئیبن مەسعود رضي الله عنه گوتی: نوێژ دەستپێدەکەیت بە خوێندنی (الله أکبر)، و ستایش

پەروەردگارت دەكەیت، و سەڵەوات لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ دەدەیت، پاشان دوعا دەكەیت یان دەپاڕێیتەوە بە هەمان شێوە، پاشان (الله أكبر) دەكەیت و هەمان شێوە دەكەیت، پاشان (الله أكبر) دەكەیت و هەمان شێوە دەكەیت، پاشان قورئان دەخوێنیت پاشان (الله أكبر) دەكەیت و دەچیتە ڕكوع، پاشان هەڵدەستیتەوە قورئان دەخوێنیت و ستایشی پەروەردگارت دەكەیت و سەڵەوات لەسەر پێغەمبەری خوا محمد ﷺ دەدەیت، پاشان دەپاڕێیتەوە و (الله أكبر) دەكەیت و هەمان شێوە دەكەیت، پاشان (الله أكبر) دەكەیت و هەمان شێوە دەكەیت، پاشان دەچیتە ڕكوع؛ حوزەیفە و ئەبوموسا گوتیان: ڕاستی گوت باوكی عبدالرحمان[1].



---

(١). إسناده موقوف حسن.

٤٧. ٩٠. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ قَالَ: (كُنَّا بِالْخَيْفِ وَمَعَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِي عُتْبَةَ فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، وَصَلَّى عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَدَعَا بِدَعَوَاتٍ، ثُمَّ قَامَ فَصَلَّى بِنَا).

له عبداللهی كوڕی ئەبوبەكرەوە رحمه الله دەڵێت: له خەیف بووین له مینا له نزیك جەمەرات، و عبداللهی كوڕی ئەبوعوتبەمان لەگەڵدا بوو، سوپاس و ستایشی خوای كرد و سەڵەواتیدا لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ، و بە چەند دوعایەك پاڕایەوە، پاشان هەستا و نوێژی پێكردین[١].



٤٨. ٩١. عَنِ الشَّعْبِيِّ قَالَ: (أَوَّلُ تَكْبِيرَةٍ مِنَ الصَّلَاةِ عَلَى الْجِنَازَةِ ثَنَاءٌ عَلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ، وَالثَّانِيَةُ صَلَاةٌ عَلَى النَّبِيِّ، وَالثَّالِثَةُ دُعَاءٌ لِلْمَيِّتِ، وَالرَّابِعَةُ السَّلَامُ).

---

(١). إسناده موقوف حسن.

لە شەعبییەوە ﵀ دەڵێت: یەکەم تەکبیرە لە نوێژی جەنازە ستایشکردنی خوای باڵادەستە، دووەم سەڵەواتدانە لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ، سێیەم دوعاکردن بۆ مردووەکە، چوارەم سەلامدانەوەیە[1].

٤٩. ٩٢. عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ: (أَنَّهُ يُكَبِّرُ عَلَى الْجِنَازَةِ وَيُصَلِّي عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، ثُمَّ يَقُولُ: اللَّهُمَّ بَارِكْ فِيهِ وَصَلِّ عَلَيْهِ وَاغْفِرْ لَهُ وَأَوْرِدْهُ حَوْضَ نَبِيِّكَ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ).



لە نافعەوە دەڵێت: ئیبن عومەر ﵄ (الله أكبر)ی دەکرد لەسەر جەنازە و سەڵەواتیدەدا لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ، پاشان دەیگوت: (اللَّهُمَّ بَارِكْ فِيهِ وَصَلِّ عَلَيْهِ وَاغْفِرْ لَهُ وَأَوْرِدْهُ حَوْضَ نَبِيِّكَ ﷺ)[2].

---

(١). إسناده موقوف صحيح.

(٢). إسناده موقوف صحيح.

٥٠. ٩٣. عَن أبي سعيد المَقْبُري عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: (سُئِلَ كَيْفَ نُصَلِّي عَلَى الْجِنَازَةِ؟ قَالَ: أَنَا لَعَمْرُ اللَّهِ أُخْبِرُكَ: أَتْبَعُهَا مِنْ أَهْلِهَا، فَإِذَا وُضِعَتْ كَبَّرْتُ وَحَمِدْتُ اللَّهَ وَصَلَّيْتُ عَلَى نَبِيِّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثُمَّ أَقُولُ: اللَّهُمَّ هَذَا عَبْدُكَ ابْنُ عَبْدِكَ وَابْنُ أُمَّتِكَ كَانَ يَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُكَ وَرَسُولُكَ وَأَنْتَ أَعْلَمُ بِهِ، اللَّهُمَّ إِنْ كَانَ مُحْسِنًا فَزِدْ مِنْ إِحْسَانِهِ، وَإِنْ كَانَ مُسِيئًا فَتَجَاوَزْ عَنْهُ، اللَّهُمَّ لَا تَحْرِمْنَا أَجْرَهُ، وَلَا تَفْتِنَّا بَعْدَهُ).

له ئەبوسەعید مەقبورییەوە رحمه الله دەڵێت: پرسیارکرا لە ئەبوهورەیرە رضي الله عنه چۆن نوێژ بکەین لەسەر جەنازە؟، گوتی: سوێند بە ژیانی خوای پەروەردگار بۆت باس دەکەم: لای کەسوکارەکەیەوە شوێن جەنازەکە دەکەوم، ئەگەر دانرا (الله اكبر)ی لەسەر دەکەم و ستایشی خوا دەکەم و سەڵەوات دەدەم لەسەر پێغەمبەرەکەی، پاشان دەڵێم: (اللَّهُمَّ هَذَا عَبْدُكَ ابْنُ عَبْدِكَ وَابْنُ أُمَّتِكَ كَانَ يَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُكَ

وَرَسُولُكَ وَأَنْتَ أَعْلَمُ بِهِ، اللَّهُمَّ إِنْ كَانَ مُحْسِنًا فَزِدْ مِنْ إِحْسَانِهِ، وَإِنْ كَانَ مُسِيئًا فَتَجَاوَزْ عَنْهُ، اللَّهُمَّ لَا تَحْرِمْنَا أَجْرَهُ، وَلَا تَفْتِنَّا بَعْدَهُ)[١].



٥١. ٩٤. عَنْ سَعِيد بْنِ الْمُسَيِّبِ قَالَ: (إِنَّ السُّنَّةَ فِي صَلَاةِ الْجِنَازَةِ أَنْ يَقْرَأَ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ، وَيُصَلِّيَ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، ثُمَّ يُخْلِصَ الدُّعَاءَ لِلْمَيِّتِ مَتَى يَفْرُغُ، وَلَا يَقْرَأَ إِلَّا مَرَّةً وَاحِدَةً، ثُمَّ يُسَلِّمَ فِي نَفْسِهِ).

له سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە رحمه الله دەڵێت: سوننەت ئەوەیە له نوێژی جەنازەدا سورەتی فاتحه بخوێندرێت، و سەڵەوات بدرێت لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ، پاشان بە دڵسۆزییەوە دوعا بۆ مردووەکە بکات

(١). إسناده موقوف صحيح.

هەتا کۆتایی نوێژەکە، تەنها یەکجار نەبێت قورئان ناخوێنێت، پاشان بە دەنگی نزم سەلامدەداتەوە[1].



٥٢. ٩٥. عَنْ أَبِي الْعَالِيَةِ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ وَمَلَٰٓئِكَتَهُۥ يُصَلُّونَ عَلَى ٱلنَّبِيِّۚ ﴾(الأحزاب: ٥٦)، قَالَ: (صَلَاةُ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ عَلَيْهِ ثَنَاؤُهُ عَلَيْهِ، وَصَلَاةُ الْمَلَائِكَةِ عَلَيْهِ الدُّعَاءُ).

لە ئەبوعالییەوە رحمه الله: بێگومان خوای پەروەردگار و فریشتەکانی سەڵەواتدەدەن لەسەر پێغەمبەری خوا؛ دەڵێت: سەلاَتی خوای بالاَدەست ستایشکردنی پێغەمبەرەکەیەتی ﷺ، و سەلاَتی فریشتە دوعا بۆ کردنییەتی[2].



---

(١). إسنادە موقوف صحيح.

(٢). إسنادە موقوف حسن.

٥٣. ٩٨. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ دِينَارٍ قَالَ: (رَأَيْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ يَقِفُ عَلَى قَبْرِ النَّبِيِّ وَيُصَلِّي عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا).

له عبداللەی کوڕی دینارەوە رحمه الله دەڵێت: عبداللەی کوڕی عومەرم رضي الله عنهما بینی، لای قەبری پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبوبەکر و عومەر رضي الله عنهما دەوەستا[1].



٥٣. ٩٩. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ دِينَارٍ قَالَ: (رَأَيْتُ ابْنَ عُمَرَ إِذَا قَدِمَ مِنَ سَفَرٍ دَخَلَ الْمَسْجِدَ، فَقَالَ: السَّلَامُ عَلَيْكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، السَّلَامُ عَلَى أَبِي بَكْرٍ، السَّلَامُ عَلَى أَبِي، وَيُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ).

---

(١). إسناده موقوف صحيح، وهو في (الموطأ) بهذا اللفظ، ومن طريقه رواه البيهقي بلفظ: (رَأَيْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ يَقِفُ عَلَى قَبْرِ النَّبِيِّ ﷺ ثُمَّ يُسَلِّمُ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ وَيَدْعُو، ثُمَّ يَدْعُو لِأَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ رضي الله عنهما).

له عبداللهی کوڕی دینارەوه ﷀ دەڵێت: عبداللهی کوڕی عومەرم ﭭ بینی، له سەفەرێك گەڕایەوه ڕۆیشتە مزگەوتەوه، گوتی: سەلامت لێ بێت ئەی پێغەمبەری خوا، سەلام له ئەبوبەکر، سەلام له باوکم، و دوو ڕکات نوێژی دەکرد(١).

❁ ❁ ❁

٥٤. ١٠٠. عَنْ نَافِعٍ: (أَنَّ ابْنَ عُمَرَ كَانَ إِذَا قَدِمَ مِنْ سَفَرٍ دَخَلَ الْمَسْجِدَ، ثُمَّ أَتَى الْقَبْرَ فَقَالَ: السَّلَامُ عَلَيْكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، السَّلَامُ عَلَيْكَ يَا أَبَا بَكْرٍ، السَّلَامُ عَلَيْكَ يَا أَبَتَاهُ).

له نافعەوه ﷀ دەڵێت: ئیبن عومەر ﭭ ئەگەر له سەفەر بگەڕایەتەوه دەڕۆیشتە مزگەوتەوه، پاشان دەچوو بۆ لای قەبرەکەی پێغەمبەری خوا

(١). إسناده موقوف صحيح.

ﷺ و دەیگوت: سەلامت لەسەر بێت ئەی پێغەمبەری خوا، سەلامت لەسەر بێت ئەی ئەبوبەکر، سەلامت لەسەر بێت ئەی باوکە[1].



٥٥. ١٠٢. عَنْ مُنَبِّهِ بْنِ وَهْبٍ: (أَنَّ كَعْبًا دَخَلَ عَلَى عَائِشَةَ فَذَكَرُوا رَسُولَ اللَّه، فَقَالَ كَعْبٌ: مَا مِنْ فَجْرٍ يَطْلُعُ إِلَّا وَيُنَزَّلُ سَبْعُونَ أَلْفًا مِنَ الْمَلَائِكَة حَتَّى يَحُفُّوا بِالْقَبْرِ يَضْرِبُونَ بِأَجْنِحَتِهِمْ وَيُصَلُّونَ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، حَتَّى إِذَا أَمْسَوْا عَرَجُوا، وَهَبَطَ سَبْعُونَ أَلْفًا حَتَّى يَحُفُّوا بِالْقَبْرِ يَضْرِبُونَ بِأَجْنِحَتِهِمْ فَيُصَلُّونَ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، سَبْعُونَ أَلْفًا بِاللَّيْلِ وَسَبْعُونَ أَلْفًا بِالنَّهَارِ، حَتَّى إِذَا انْشَقَّتِ الْأَرْضُ خَرَجَ فِي سَبْعِينَ أَلْفًا مِنَ الْمَلَائِكَةِ يَزِفُّونَهُ).

لە مونەبهی کوڕی وەهب رحمه الله دەڵێت: کەعب رضي الله عنه ڕۆیشتە ژوورەوە بۆ لای عائیشە رضي الله عنها باسی پێغەمبەری خوایان ﷺ کرد، کەعب گوتی:

---

(١). إسناده موقوف صحيح.

هیچ ڕۆژێك گزنگ نادات ئیللا حەفتا هەزار فریشتە دادەبەزنە دەوری قەبرەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە شەقەی باڵ دەدەن و سەڵەوات لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ دەدەن، ئەگەر شەویان بەسەردا هات بەرزدەبنەوە، حەفتا هەزار فریشتەی تر دادەبەزنە دەوری قەبرەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە شەقەی باڵ دەدەن و سەڵەوات لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ دەدەن، حەفتا هەزار بە شەو و حەفتا هەزار بە ڕۆژ، هەتا کاتێك زەوی شەق دەبات حەفتا هەزار فریشتە دەردەچن بە خێرا بە ڕێی دەکەن[1].



٥٦. ١٠٣. عَنْ مُجَاهِدٍ: (﴿وَرَفَعْنَا لَكَ ذِكْرَكَ ۝٤﴾(الشرح)؛ قَالَ: لَا أُذْكَرُ إِلَّا ذُكِرْتَ أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ).

---

(١). إسناده مقطوع ورجاله كلهم ثقات.

لە موجاهیدەوە ﷫ دەڵێت: ئەو ئایەتەی دەفەرموێت: ناو و ناوبانگی تۆمان بەرز ڕاگرتووە ئەی پێغەمبەری خوا؛ واتە: زیکری من ناکرێت ئیللا ناوی تۆش دەهێنرێت: (أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ)[1].



٥٧. ١٠٤. عَنْ قَتَادَةَ: (﴿وَرَفَعْنَا لَكَ ذِكْرَكَ ﴿٤﴾﴾(الشرح)، فَقَالَ النَّبِيُّ: ((ابْدَءُوا بِالْعُبُودِيَّةِ وَثَنُّوا بِالرِّسَالَةِ))؛ قَالَ مَعْمَرٌ: أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ: فَهَذَا الْعَبُودِيَّةُ، وَرَسُولُهُ أَنْ يَقُولَ: عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ).

لە قەتادەوە ﷫ دەڵێت: ئەو ئایەتەی دەفەرموێت: ناو و ناوبانگی تۆمان بەرز ڕاگرتووە ئەی پێغەمبەری خوا؛ پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: بە بەندایەتی دەست پێ بکەن، دوای ئەوە بە

(١). إسناده مرسل صحيح، فهو حديث قدسي مرسل.

پێغەمبەرایەتی؛ مەعمەری رحمه الله دەڵێت: (أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ) ئەمە بەندایەتییە، و پێغەمبەرایەتی ئەوەیە بگوترێت: (عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ)(١).



٥٨. ١٠٥. عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ: (أَنَّهُ رَآهُمْ يَسْتَقْبِلُونَ الْإِمَامَ إِذَا خَطَبَ وَلَكِنَّهُمْ كَانُوا لَا يَسْعَوْنَ(٢) إِنَّمَا هُوَ قَصَصٌ وَصَلَاةٌ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ).

لە ئیسحاقەوە رحمه الله دەڵێت: هاوەڵانم بینی کاتێك ئیمام خوتبەی دەدا ڕوویان تێدەکرد، بەڵام بەپەلە نەدەڕۆیشتن، خوتبەکە بریتی بوو لە باسی بەسەرهات و سەڵەوات لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ(٣).

---

(١). إسناده مرسل صحيح ورجاله كلهم ثقات.

(٢). يحتمل مع بعد أن تكون (يستنون) من السنة أي: النافلة.

(٣). إسناده موقوف صحيح.

٥٩. ١٠٦. عَنْ فَضَالَةَ بْن عُبَيْدٍ صَاحِبَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: ((سَمِعَ رَسُولُ اللَّهِ رَجُلًا يَدْعُو فِي صَلَاتِهِ لَمْ يُمَجِّدِ اللَّهَ وَلَمْ يُصَلِّ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: عَجِلَ هَذَا، ثُمَّ دَعَاهُ فَقَالَ لَهُ أَوْ لِغَيْرِهِ: إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ فَلْيَبْدَأْ بِتَمْجِيدِ اللَّهِ وَالثَّنَاءِ عَلَيْهِ ثُمَّ يُصَلِّي عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثُمَّ يَدْعُو بَعْدُ بِمَا شَاءَ)).

فەزالەی کوڕی عوبەید هاوەڵی پێغەمبەری خوا ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ گوێی لە پیاوێك بوو لە نوێژەکەیدا دوعای دەکرد لە دوعاکەیدا خوای بەگەورە دانەنا و پیایدا هەڵنەدا، و سەڵەواتی لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ نەدا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەم پیاوە پەلەی کرد، پاشان بانگی کرد بەو پیاوە یان بە کەسێکی تری فەرموو: ئەگەر کەسێك لە ئێوە نوێژی کرد بە بەگەورە دانان و ستایش و

پەسندانی خوا دەست پیٚ بکات، پاشان سەڵەوات لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ بدات، پاشان چی دوعایەکی دەوێت بیکات.



٦٠. ١٠٧. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الْحَارِثِ: (أَنَّ أَبَا حَلِيمَةَ مُعَاذًا كَانَ يُصَلِّي عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الْقُنُوتِ).

لە عبداللەی کوڕی حارسەوە رحمه الله دەڵێت: ئەبوحەلیمە موعازی کوڕی حارسی ئەنصاری قارییٔ سەڵەواتی لەسەر پێغەمبەری خودا ﷺ دەدا لە قنوتدا[١].



(١). إسناده موقوف صحيح.

